




# نامه یه كی كراوه



## بۆقوتابیه هاوپۆله‌كانم

# له دوای كۆلێژ ته‌واوكردن

## ( كارت چی ده بێت )

نوسین وئاماده كردنی
نه‌وره‌س احمد محمد

پێداچوونه‌وه‌ی زمانه‌وانی
م: كارزان محمد علی

# نامەیەکی کراوە بۆقوتابییە هاوپۆلەکانم

# لە دوای تەواوکردنی کۆلێژ

# ( کارت چی دە بێت ؟ )

نوسین وئامادە کردنی

**نەورەس احمد محمد**

پێداچوونەوەی زمانەوانی

**مامۆستا کارزان محمد علی**

**١ محرم ١٤٣٧ ھ**

**٢٠١٥ م**

سوپاس و پێزانین بۆ:

**م: كارزان محمد علی، ئەركی پێداچوونەوەی ئەم نامیلكەیەی گرتۆتەئەستۆ**

پێشكەشە بە:

دایك وباوكی ئازیزم.

بەو قوتابیانەی كە نرخی ژیان وكات دەزانن.

بە هەموو هاورێیانم.

# پێشەکی

سەرەتا پیرۆزبایی لەخۆم و ئێوەی خۆشەویست دەکەم، بەبۆنەی دەرچوونمان لە قۆناغی (سێیەم)دوە بۆ قۆناغی (چوارەم). کە کۆتا قۆناغە لە زانکۆی زانستە ئیسلامیەکان، لەم کۆتاساڵەی خوێندنمان بیرۆکەی نووسینی بابەتێکم لەلادروست بوو، ئەویش قۆناغی دوای دەرچوونمانە لە زانکۆ، لە دوای دەرچوون و تەواوکردنمان دەبێت وەڵامی ئەم رستەیە

( ئــەركمان چــی دەبێــت؟ ) بەشــێوەیەکی جــوان بدەینــەوە و لــە ژیانمانــدا بەرجەســتەی بکــەین.

هەرچــەندە نووســـین لەســـەر ئـــەو بابەتـــە زۆر هەڵــدەگرێت، هـــەروەك چـــۆن نوســـەری کـــورد "بـــەختیار عـــەلی" دەڵێـــت: (( ئەگـــەر بتـــەوێت گەڵایـــەك بنووســـیتەوە، پێویســـتە دارســـتانێك بخوێنیتەوە. )) بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا، بـەو توانـا کەمەی کە هەمە، حەزدەکـەم هەنـدێك پـەیام لـەو بارەیـــەوە بکـــەینم. بـــەڵێ زۆر گرنکـــە دوایـــی دەرچوونمان لە زانکۆ دەبێت بـزانین ئـەرکی سـەر شـانمان چـییە؟ هـــەروەکو هـــەمووومان دەزانـــین وشـــەی ( زانکـــۆ ) لـــە رووی رێزمانییـــەوە نـــاوێکی لێکـدراوە، لـە چـاووگی ( زانـین ) و ( کۆکردنـەوە ) ( زان + کـۆ ) واتــە: ( کۆکردنـــەوەی زانســـتەکان )

بـــەڵێ ئێمـــە کاتێـــك دێینـــە زانکـــۆ پاشـــتر بـــە سەرکەوتوویی تەواوی دەکەین و ئێمە چوار ساڵ دەخوێنین ئەوەش تارادەیەك زانیارییەکی باشمان بـۆ کۆدەکاتـــەوە، دەبێـــت کاتێـــك زانکـــۆ تـــەواو دەکەین، فێـری زانسـت و زانیاریـەکی بـاش بـین و سوودمان بە خۆمان گەیاندبێت و هەروەها بتوانین سوود بە خەڵکیش بگەینین. واتـە کاراکتـەرێکمان لێ دورسـت بێـت سـوودێکی باشمـان بـۆ کۆمـەڵگا هـەبێت و کاریگـەری ئـەرێنیمان لەسـەر هـەبێت.، نـەك وابـزانین زانکـۆ تـەنها شـوێنی نمایشـکردنی جلوبـەرگ و ماشـێنی مۆدیـل بـەرز، یـان هەنـدێك شـتی تـری لاوەکـی وەك مۆبایـل و کاتـژمێر و.... قوتـابیی وا هەیـە ڕەنگـە مۆبایلەکـەی نرخەکـەی چوار سـەددۆلار یـان پێـنج سـەددۆلاربێت، بـەڵام

دینــارێکی لــەگیرفان نــەبێت، ئەمــەش کــارێکی

هەڵەیـە. یـان وابـزانین خوێنـدن بـارێکی گرانـە بـە

سەرمانەوە، چاوەڕێی ئە وە بکەین کەی ئەو چوار

ساڵە کۆتایی دێت و ڕزگارمان بێت.بـەڵێ ئەگـەر وا

بیربکەینـەوە ئـەوە نـەدەتوانین سـوود بـەخۆمان

بگەینین و نەبەکۆمەڵگا. هەروەهازۆر لە قوتابییان

دەڵــێن: (( خوێنــدن هــیچ نیــە و ئامــانجێکی

وانییەوئێمـەکاتێك دەردەچـین لـە هـیچ شـوێنێك

وەرنــاگیرێین و دانامــەزرێین. )) بەتایبــەتی ئــەو

نارازاییە زیاترە لە کۆلێژی زانستە ئیسلامییەکان

کەدانامەزرێن لە هیچ شوێنێك. دە لێن ئە وە چەند

ســاڵە؟ قوتــابی دەردەچــێت، بــەڵام کــەس

دانامـەزرێنێت حکومـەت، بـەڵێ وایـە تارادەیـەکی

زۆر قوتـابی دانامــەزرێنن و بەتایبـەتی دەرچـووی

کۆلیژی زانسته ئیسلامیەکان، (بەلأن نابێت ئەوە هەرگیز ساردمان بکاتەوە.) چونکە دەتوانین خۆمان دوای ئەوەی کەدەرچووین لەکۆلیژ سوود بەخۆمان و بە ماڵ و منداڵمان و بە هاوڕێ یەکانمان بگەیەنین، بەو زانستەی کە فێری بووین لە زانکۆ، هەرچەندە زانکۆ هەمووشتێکت فێرناکات، دەبێت خۆت زیاتر هەوڵ بدەی، (چونکەکۆلێژ زانیاریمان لە سەدا٣٠٪ فێرت دەکات)، (سەدا ٧٠٪دەبێت خۆمان هەوڵ بدەین)، بەشێوەیەکی گشتی لەدوای کۆلێژ کەدەرچووین (کارمان چی دەبێت؟) لە چەند خاڵێك کۆدەکەمەوە:

١-ڕۆژانە خوێندنەوەمان هەبێت، بەلایەنی کەم (٢٠) خولەك بخوێنینەوە، تابیرمان زیاتر

رۆشن بێت، بەلاَم لە هەموو پەرتووكێك كە زیاتر گرنگی پیِّ بدەین با (قورئان) بێت، چونكە هیچ پەرتووكێك وەك قورئان نیە، لە راستی قسەكانی و لە پەیمانەكانی و لەخێر بەدەست هێنانی.

(چونكە یەك پیت بخوێنین لە قورئان دە (١٠) چاكەمان بۆدەنووسری) هەر وەك لە فەرموودەیەك هاتوو، لە عەبدوللاَی كوڕی مسعود(رەزای خوای لیّ بێت)ئەفەرموێت:(مَنْ قرأ حَرفاً مِنْ كتابِ الله فلهُ حَسَنَةٌ والحسنة بِعشْرِ أمثالِها، لا أقول: الم حَرفاً، ولكِنْ: ألف حَرفٌ، ولامُ حَرفُ، وميمُ حَرفٌ)[1]

واتە: هەر كەسێك پیتێك بخوێنێت لەقورئانەكەی خوا ئەواچاكەیەكی بۆئەنوسرێت،

---

(١) صحيح: رواه الترمذي(٣١١٣).

چاکەیەکیش دە قاتە، من نالّێم (الم) پیتێکە، بەڵام (الف) پیتێکەو (لام) پیتێکەو (میم) پیتێکە. لەپاشان گرنگی بە فەرموودە بدە، چونکە لەپاش قورئان هیچ زانستێك چاك نیە وەکو فەرموودە راستە کان، چونکە بەڵگەت بەهێزدەکات، هەروەك زانای بەرێز ( ابن القیم ) ( رەحمەتی خوای لیٚ بێت ) فەرموویەتی (العلم: قال الله، و قال رسول الله صلی الله علیه وسلم، و قال الصحابه) واتە: زانست ئەوەیە خوا فەرموویەتی، هەروەها پێغەمبەر و هاوەڵەکان فەرموویانە ( خوا لێیان رازی بیٚ )

٢- هەوڵ بدەن دابمەزرێن، جا بەرەسمی بێت یان بەشێوەی گرێبەست بێت، لە قوتابخانە بێت، یان لەفەرمانگەیەك بێت بە فەرمانبەر، یان بۆ

کوڕەکان، ببنە مامۆستا لە قوتابخانە، یان ببن بە پێشنوێژ و وتاربێژ لەمزگەوت، خەڵکی پێ بگەیەنین و پەروەردە یەکی ڕاستیان بکەین و با جێ پنجەتان دیار بێت لەو دونیایە، چونکە یەکێك لە زانایان دە ڵێت (ئەگەر لەو دونیایە شتێك زیاد نەکەی دیارە بەخۆت زیادی).

٣- کە تە واوبووین لە کۆلیژ، بانەڵێین تەواو ئەوە هاورێی کۆلیژم بوو ئیتر کارم پێی نەما، نەخێر هەزار جار نەخێر، بەڵکو دەبێت بەوەفابین بەرانبەر بەیەکتری سەردانی یەکتربکەین و نزای بەخێر بۆ یەکتربکەین و یەکتر لە بیرنەکەین و ژمارە تەلەفۆنی یەکتر وەربگرن، چونکە خوای گەورە فەرموویەتی ﴿ ٱلْأَخِلَّآءُ يَوْمَئِذٍۭ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ عَدُوٌّ إِلَّا ٱلْمُتَّقِينَ ﴿٦٧﴾ ﴾ الزخرف: ٦٧

واتە: لەو ڕۆژەدا دۆستان هەموو دەبنە دوژمنی یەکتر، پارێزگاران نەبێت. بەڵێ تەنها ئەوانە نەبێت کە لە خواترسن ئەوانی تر هەموو دەبنە دوژمنی یەکتر. هەروەها پێغەمبەری پێشەوامان( صلی الله علیه وسلم )دە فەرموویت (المرء علی دین خلیله فلینظراحدکم من یخالل[1])

واتە: ( مرۆڤ لە سەر ئایینی خۆشەویستەکەیەتی، جا بایەکێك لە ئێوە بروانێت بۆئەوەی بزانێت کێی خۆش دەوێت( برادەرێتی کێ دە کات ) بەڵێ برادەر و هاورێ ی چاك، نیعمەتێکە لە نیعمەتە گەورەکانی خوای گەورە، کە پێمان ببەخشێت، چونکە هەردەم هاوکاریمان دەکات لەچاکە وریگریمان لێ دەکات لە خراپە. لە ناخۆشی لە گە

(١) الصحيحة : رقم ٩٢٧.

ڵماندایە وپشتت بەرنادات لەبەر خوا تۆی خۆش
دەوێت و بەتەنهاو لەبەرهیچی تر نا، بەپێچەوانەی
برادەری بەرژەوەندخواز، کە بەرژەوەندی لەگەڵ
تۆنەما ئیتر وازت لێ دێنێت و وەکو ئەوەی هەرگیز
تۆی نەناسی بێت وایە، تەنها لەخۆشی لەگەڵ
تۆدایە. هەر بەراستی ئەوە دوژمنە، نەك هاوڕێ
لەو جۆرە هاورێیانە دەبێت خۆمان بە دووربگرین
و نزیك نەبینەوە لێیان. بە تایبەتی لەو
سەردەمەدا ئەو جۆرە بەناو هاورێیانەزۆربوونە،
پێویستە خۆمانیان لێ بەدووربگرین، یەکێك
لەنیشانەی هاورێی بە وەفا و راست، ئەوەیە دڵ
خۆش دەبێت کە تۆ دڵخۆشی، دڵ تەنگ دەبێت
کاتێك کە تۆ دڵتەنگ دەبیت، دڵ خۆشەکە تۆ
دەوڵەمەندی و ئیرەییت پێ نابات و نزای خێرت بۆ

دەكات كاتێك تۆ لەلای نەبیت، كاتێك پێویستیت بەیارمەتیەك هە بێت هەرچی لە توانای دابێت بۆت دەكات، بەلأم برادەری خراپ بەپێچەوانەی ئەوەیە كە لە سەرەوە باسمان كردووە.

٤-ئەگەر بۆمان گونجا درێژە بەخوێندن بدەین و لەماستەر پاشان دكتۆرا بخوێنین، ئەوابائەوهەڵە لەدەست نەدەین، بە تایبەتی ئەوانەی كە خێزاندارنین و ژیانی هاوسەرگیریان پێك نەهێناوە، چونكە زۆر جار هەلمان بۆ رێك دە كە وێت، هەلّ نە قۆزینەوە ئەوا لە دەست دەچێت و رەنگەجارێكی تر نەگەرێتەوە، ئەوانەی كە خێزاندارن ئەگەر خۆێندنی ماستەر لەسەر مافی خێزانەكەیان نەبێت ئەوابا راستەوخۆبخوێنن بۆ ماستەر وپاشان دكتۆرا، مەبەستم لەسەر مافی

خێزانەکەت نەبێت ئەوەیە مافی نەخۆیت و فەرامۆشی نەکەیت و لە کاتی ئەوان بدەی بە خوێندن، چونکە ئەگەر ئافرەتێك هاوسەری هەبێت و منداڵی هەبێت، بچێت لەسەرحیسابی ئەوان بخوێنێت و هیچ گرنگیان پێ نەدات ئەوا ئەوکاتە نەخوێنێت باشترە چونکە توشی کێشەدەبێت، چونکە مێرد و منداڵەکانی مافیان لەسەریەتی و دوایی دەبێتە کێشەلەنێوانیان.

بەڵام ئەگەر هاوسەرکەی پشتی بگرێت و یارمەتی بدات، ئەوا کارێکی زۆر چاك و باشە، هەروەها پیاویش لەسەر حیسابی خێزانەکەی نەخوێنێت باشترە ئەگەر بۆت گونجا راستەوخۆ بخوێنە، دوای تەواوبوونی کۆلێژ یان دوو ساڵ راوەستەو لەپاشان هەوڵبدە بۆ ماستەر بخوێنیت، چونکە

ئەودووسساڵەدەتوانی لــە رووی زانســتەوە خــۆت شارەزاتر بکەی و بەرەو پێشەوە بچیت و لـە رووی مادیشەوە بەهــەمان شـێوە، چـونکە بەئەنـدازەی هــەوڵ دان بــەرزی بــە دە ســت دێــت، هــەروەکو (موتەنەبی) دەڵێت:

**"بـــە ئـــە نـــدازە ی هیلاکـــی پلـــە و پایـــە**
**بەدەست دێنێت هەرکەس داوای پایە بکـات،**
**دەبێـــــــت شــــــــەونخونی بچــــــــێژێت**
**هەر کەس بەبێ هیلاکی داوای پلە وپایە بکات**
**تەمەنی خۆی لەئـە ستەمدا بـەرێ دەکـات"**

٥-هــەرگیز ئــەوەت لــە بیرنەچــێت و خــۆت لێ نەگۆرێت کەوا تۆ خوای گەورە بۆ پەرستنی خـۆی دروستی کردووی هــەروە کـو خـۆی فـە رموویـەتی

﴿ وَمَا خَلَقْتُ ٱلْجِنَّ وَٱلْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ ﴿٥٦﴾ ﴾[1]

واتــــه : (مـــن هــــەر بۆیـــه جنۆكـــه و ئـــادەمیم دروســـتكردووه بـــۆ ئـــەوەی بمپەرســـتن وبمناســـن، چـونكه ئەگـەر لـه نەبوونـەوه نـەمهێنابان، نـەیان ئەناسیم و گەورە ییم دەرنەئەكەوت بۆیان)[2].

بــەلێ بـا هــەرگیز ئـەو راسـتیه لەبیرنەكـەین و هەوڵی بۆ بدەین خۆمانی لێ فێربكەین وخەڵكیشـی لێ فێربكەین. هەرگیز یەكتاپەرستی خوامان لەبیر نەچـێت و چـونكه ئــەوه گــەورەی هــــەموو زانســـتەكانه، چـونكه ئــەوه بانگــەوازی هــەموو پێغەمبەرانــه، زانســـتی یەكتاپەرسـتی بنچـینه و ئەصلەو زانستەكانی تر لق و پۆپن، نامەوێت لێره

---

(١) سورة الذاريات (٥٦).

(٢) تەفسیری رامان.

زیاتر باسی ئەوبابەتە بکەم، بۆ زیاتر شارەزابوون لـەو بابەتـە ، سـەیری ئـەو نامیلکەیەبکـە( تـاوانی هەرەگە ورە )[1] لەوێ بە تێروتەسەلی باسی کراوە، هەروەهاچەند کتێبێکی بەسوود هەیەونووسـراوە لەلایـــەن ( زانایـــان ) ئـــەوەش دوای قورئـــان و فەرموودە، ئەو کتێبانەش بریتین لە :-

أ. كتاب التوحيد (امام ابن خزيمة) (رحمه الله).

ب. اقتضاء صراط المستقيم (امـام ابـن التيميـة) (رحمه الله).

ت. العقيدة الواسيطية (امام ابـن التيميـة)(رحمـه الله).

ث. كتاب التوحيد (الشيخ: محمدبن عبـدالوهاب) (رحمه الله).

---

(١) وەرگێڕدراوی نوسەر.

ج. اخطـاء في العقيـدة وتنبيهـات مهمـة (للشـيخ: عبدالعزيزبن عبدالله باز) (رحمه الله).

ح. قواعـد المثلـى في صـفات لله واسمائـه الحسـنى (الشيخ: محمد بن صالح العثيمين) (رحمه الله).

خ. عقيدة التوحيد، يان كتاب التوحيد (للشـيخ: صالح بن الفوزان) (حفظه الله تعالى).

ئەوانە چەند کتێبـك بـوون لەسـەر ( التوحيـد و يەك خواپە رستی دەتوانی بۆخـۆت سـوومەندبیت لێـان، چـە نـد پـەرتوك ونامیلکـەی تـر هـەن کەوەرگێردراون بۆ زمانی کوردی بریتین لە ( مانای لااله الا الله )، پلە وپایەی فەزڵو گەورەیی یەکـەی وە شـوێنەواری لەسـەر تـاك و کۆڵگـا ) نووسـینی زانای بە رێز؛ صالح بن فوزان، نامیلکەکەی شیخ؛

محمـــدبن جميـــل زينـــوّ، بـــەناوی ( بیروبـــاوەڕت وەربگـــرە لـــە قورئـــان و ســـونەت ) چـــەندان کتێبـــی تـــریش هـــەن دەتـــوانین ســـوودمەندبین لێیـــان وە ؛ دووربکـــەوە لـــە هەڵـــە و کەوتنـــە نـــاو (شـرك، کفر، بدعـة ) وە زانـــین و ناســـینی (التوحيـد، السـنة ) تـــا بیروباوەرێکی رێك وپێك و راستت هەبێت.

٦- گرنگی بەتەندروستی خۆمان بـدەین، رۆژانـە وەرزش بکـــەین و ئەگـــەر بـــۆ ( ٥ ) خولـــەکیش بێـــت، ئاو زۆر بخۆینەوە و تا لەشمان تووشـــی وشك بوونەوە نەبێت.

٧- بەشداری خولی زمان بکەین، تازیـاتر فێـربین و زیاتر سوومەندبین، بەشداری خـول بکـەین، بۆ بەرزکردنەوەی ئاستی رۆشنبیریمان وببینە

ئەندامێکی چالاك لەکۆمەڵگا، ببین بە مۆم دە
ورو بەرمان رووناك بکەینەوە.

٨- چۆن دە تـوانین خزمـە تـی ئیسـلام بکـەین، بەڵام بە رێگەی شـەرعی بێـت، ئـەوا بیکـەین، ئەگـەر دەتـوانین بنووسـین ئـەوا بنووسـین، دەتـوانین ئامۆژگـاری بکـەین لەسـەر زانسـت ونـــەرم ونیـــانی ئـــەوا بیکـــەین، دەتـــوانین وتاربـدەین ئـەوا ئـەنجامی بـدەین، دەتـوانین خەڵك فێری زانسـت بکـەین ئـەنجامی بـدەین، دەتـــوانین یارمـــەتی هـــەژاران بـــدەین ئـــەوا بیکەین، دەتوانین خەڵك فێرە قورئـان بکـەین ئـەوا ئـەنجامی بـدەین، بـە هـەر شـێوەیەك دەتـوانین خزمـەت بکـەین، دەبێـت سـتتی نەکەین و ئەنجامی بدەین، جیّ پەنچەی خۆت

جێ بهێڵە لەم دونیایە، هەرگیز گوێ لەو کەسانە نەگرین، کەساردمان دەکەنەوە لەکاری چاکە، یان بڵێن ئێمەمافمان نیە بەسەرخەڵکەوە، نەخێر ئەگەر ئێمەوابیربکەینەوە، ئەوا خەڵکیش بەرانبەر بە ئێمەوا بیردەکەنەوە، کاتێك پێویستیمان بە یارمەتی بێت ئەوا خەڵك دەستی یارمەتیمان بۆدرێژناکەن، چونکە ئێمە مەبەستمان نەبووە لەسەرەتا یارمەتیان بدەین.

٩- لێ بووردەبین بەرامبەر بە دەوروبەرمان، بەرامبەر بەکەسێك کە هەڵەی کرد بەرامبەرمان لێی ببورین، چونکە تۆش

بـەدەرنیت لـە هەڵـە، تـۆش هەڵـە دەکـەی و مرۆڤی دواجار.

١٠- ئارامگربین، خوای گەورە ئارامگرانی خـۆش دەوێت، ئارامگربین بەرامبەر بەناخۆشیەکانی ژیان، نزیکەی ( ١٠١ ) ئایەت لە قورئانی پـیرۆز باسـی ئـارامگری دەکـات، بەراسـتی هـەموو شتەکان گرێدراون بەئارامگری، خوای گـەورە دە فەرموێت: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اسْتَعِينُوا بِالصَّبْرِ وَالصَّلَاةِ إِنَّ اللَّهَ مَعَ الصَّابِرِينَ﴾[1] واتە: ئەی گـەلی خـاوەن بـاوەر! پـەنا بەرنـە بـەر خـۆراگری و نوێـژکردن، هـەتا لـە سـەر قۆناغە گرژەکانی ژیانتـان خـۆراگربن، واتـە:

(١) البقرة (١٥٣).

لـەکاتی ناخۆشـیی و نارەحەتییـدا خـۆراگربن وبە جوانی نوێژبکەن، ئەوجا پاداشتان زۆردە بێت[1].

خوای گەورە دەربارەی ئارامگرتن دەفەرموێت:

﴿ إِنَّمَا يُوَفَّى ٱلصَّٰبِرُونَ أَجْرَهُم بِغَيْرِ حِسَابٍ ١٠ ﴾ الزمر:١٠.

واتە : ئارامگربن لە سەر کـۆچ و دووری لـە زێـد وخـۆ شەویسـتان، بەراسـتی بـە ئـارامگرە کـان پاداشی بێ ژمارە دەدرێتە وە[2].

هەروەها سولەیمانی کوری قاسـم (رحمـه الله) دەفەرموێت: ((کل عمل یعرف ثوابـه الا الصـبر)) لە تەفسیری ئەو ئایەتەی سەرەوە فەرمووی، قـال (کالمـاء المنهمـر) هـەموو کردارێـك پاداشـتەکەی

---

(١) تەفسیری رامان

(٢) تەفسیری رامان.

دەزانرێت جگە لە ئارامگرتن، فەرمووی پاداشتەکەیان وەك بارانی بە خورەم وایە )

دەربارەی ئارامگرتن ( خەلیل مەتران ) دەڵێت :

**"رەنج بکێشە، کەرۆیشتیت رامەوەستە ئارامگر بە، بەو جۆرە سەرکە وتنت مسۆگەرە سەرکەوتوو، ئەو کەسە نیە، کە خۆزگە دەخوازێ بەڵکو هەر کەس ئارامگربێ، سەرکەوتووە"**

١٠- ئاگامان لە کات بێت و تەنانەت خوای گەورە لەو بارەیەوە دەفەرمووێت: ( والعصر )

واتە: سوێند بە کات و رۆژگارکەچەندە گرنگ و بەنرخە، هەر لەبەرئەمەشە خوای گەورە سوێندی پێ دەخوات، چونکە (کات) بۆ مرۆڤە زیرەك ووریاکان مایەی بەختیاریی و سەرفرازییان بووە، هەوڵیان تیاداوە بۆ ئازادی و، سە ربەستی

خۆیان، هیچ پشوویان تیانەداوە، بەلاّم بۆ گەلانی تەمەڵ و نەزان بۆتەمایەی ژێر دەستەیی و بەدبەختیان، ئای چۆن چەندان ساڵ دێت ودەروات، گەلانی ژێردەستەهەردەناڵێنن؟ دەسا بۆراست نابنەوە ولە (عەصر) سود وەرگرن وەك پەیامبەر (صلی الله علیه وسلم) راپەری و سوودی لێوەرگرت و دەرەنجام گەلەکەی خستە سەرفرازییەوە.[1]

بەڵێ ژیانی ئێمە بریتیە لە کات بۆیە دەبێت زۆر رەزیل بین لەخەرجکردنی کاتەکان و بەبەرنامەبەرێوەی ببەین، تاسوودمان پێ بگەینێت، کات لە ئەڵماس و زێر زۆر بەنرخترە، چونکەئەوا نە دە توانرێت بەپارە قەرەبوو

(١) تەفسیری رامان.

بکرێتەوە بەڵام (کات ) کەرۆیشت بە هیچ قـەرەبوو ناکرێتەوە....

لەکۆتایدا داواکارم لە خوای گەورە و میهرەبان ئـــەو نوســـراوەببێتە مایـــەی ســـوود بۆخـــۆم وبۆقوتابییە خۆشەویستە هاوپۆلـەکانم، لـە نـزای خێر بێ بەشم مەکەن، خوای گەورە لێمـان خـۆش بێــت وَلــە هەڵەوکــەم و کوریــەکانمان ببورێــت و بمانخاتــە بەهەشــتەکەی خـۆی، کۆمـان بکاتــەوە لەگـەڵ پێشـەوای مرۆڤایـەتی ( محمـد ) ( صـلی الله علیە وسلم ) لە بەهەشتدا، امین یارب العامین،

ئـەوەت لـە بـیر بێـت کـە تـۆ لـەم چـرکەیەدا دەژیت، وەك ئەوەی کۆتا چرکەی ژیانت بێت...

بەخۆشەویســتی خــواوە بـژی بــە گوێرایـەڵی خواوە بژی با خۆشە ویستی خودا هە مـوو دڵمـان بگرێتەوە تامی باوە ر بچێژین، چـونکە ئـەو تامـە بەنێو هەموو لەشماندا بلاودە بێتەوە...

بۆیــه دەبێـت هەسـتی پـێ بکـەین و چـاو لـەئاکارەکانی پێغەمبـەر( صـلى الله علیـه وسـلم ) بکەین، ئەو گەورە مرۆڤەی کـە خـوا لـە بارەیـەوە دەفەرموێت:

﴿ وَإِنَّكَ لَعَلَىٰ خُلُقٍ عَظِيمٍ ﴿٤﴾ ﴾ سورة القلم: ٤

بــه راســتی شــاعیر ( شــەوقی) ش جــوانی گوتووە:

**(نەتەوەکان بەرەوشتەوە بەندن**

**ئەگەر رەوشتیان نەمێنێ، خۆشیان نامێنن)**

والحمد لله الذي بنعمته تتم الصالحات

وصلى الله على نبينا محمد وعلى اله وصحبه وسلم

**شەوی رەمەزان ١٤٣٦هـ**

**هەولێر**

پاش قورئان

١. تەفسیری رامان لە ماناو مەبەستی قورئان، ئەحمەد کاکە مەحموود، چاپی چوارم، ١٤٣٥هـ-٢٠١٤م، محوی٢.

٢. ئارامگرتن؛ لە قورئان و فەرموودە صحیحەکاندا، نووسینی محمد ملا فایق شارەزووری، چاپی یەکەم ١٤٣١هـ-٢٠١٠م.

٣. تواناکانت بە ئاگابێنە و ئایندەت دروست بکە، د.ئیبراهیم فەقێ، وەرگێرانی لەعەرەبییەوە؛ عەبدوللا جەبار، چاپی سێیەم.

٤. چەند کۆسپێك لە رێگای لاواندا، و. بە دەستکاریەوە، ادریس محمود، چاپی دووەم، ١٤٣٤هـ.

٥. بخوێنە، فێربە، خۆشبەخت بە، ئامـادەكردنی، دارا فـاروق نجـار، چـاپی یەكـەم، ٢٠١٤م، كتێبخانــە ی نارین.
٦. ولكنكم تستعجلون، محاضرة، الشیخ: د. محمـد بـن عبدالرحمن العریفی.

•

# بەرهەمەکانی نوسەر

١. چۆنیەتی عومرە کردن

٢. نامەیەکی کراوە بۆ قوتابییە هاوپۆلەکانم

٣. تاوانی هەرە گەورە(لەژێر چاپدایە)

٤. زیانەکانی گۆرانیو مۆسیقا و چارەسەرکردنی لەژێر ڕۆشنایی قورئانو فەرمودەو وتـەی زانایـان (لـەژێر چاپدایە)